بەرە و ڕێبازی ئەدەبی

شـــیعر

# هەواڵی زیندان






## محسن شوانی

بەرە و ڕێبازی ئەدەبی ئیسلامی

شـــیعر

# هەواڵی زیندان

محسن شوانی



# پێش شیعر

- هەندێ لەو بەرهەمە ئەدەبیانەی ئەمڕۆ باون وخەڵکانێك پیێەوە دەنازن، ڕۆژێ دادێ دەبنە مایەی گاڵتەجاڕی ، چونکە بەرهەمی سەردەمی ترس و تۆقاندنن .
- ئەو شاعیرانەی شیعرەکانیان سەردەمی شاخ لە ئەشکەوتا لەچاپ ئەدران پاشان لەقوژبنی ماڵەکانا لەچایخانەی دڵەکانا تۆماردەکران ئەمڕۆ حەپەسان ؟!! لەترسی شەقی کوڕی شۆڕش سەیرە بەڵێنی شاخ و کورسی شار .
- هەندێ لەوانەی گوایە خەمی میللەت بە ئاگایان دێنێتەوە، ئەمڕۆ وەك ستالین، هونەر، ئەدەب، ڕۆشنبیری و هەموو میللەت دەکەن بەقوربانی حیزب .
- زۆر تێنەدەگەیشتم لە(اطلع بره) و جوێن و شەقی دوێنێ ، بەلام ئەمڕۆ بۆنی تفی سەر ڕووم دەکەم .

# کۆچ و چەك

یەکەم ووشەی
پەرتووکی من لەحەڕرابوو
کاتێ مرۆڤ لە گێژاوی نەزانین و...
لەگومڕابوو،
جوبریلی پاك
کە سروشی بەتۆ گەیاند
( لات و عوزا )ی لەنێو دڵی
هەزار قوڕەیش بێشك ڕماند
ئەم ئیسلامە سەرنەکەوتوو
جێگیر نەبوو لەنێو دڵان ،
تاکۆچ نەکراو
شمشێر و تیر نەکرانە شان

٢٠٠٠/٨/٢

لەرۆژنامەی کۆمەڵ ژمارە (٣٧) ساڵی دووەم بڵاوکراوەتەوە

# هەوالی زیندان

تۆ زوبانی
تیژی خەنجەر باش ئەزانی
هاوڕێی پەت و...
بەند و زنجیری زیندانی،
لەشالاوی
تۆلەی مەرگی هەژارەکان
لەمان گرتن...
لەڕێ پێوان...
پەلا پیتکەی یەکەم گوللەی...
گشت داخوازی و مافەکانی ،
هۆ کاکە گیان
موسڵمانە نەدیوەکەم
ئێستا لە کوێی ؟..
لەکام زیندان
جەلادەکان دەستیان لەناوخوێنت ناوە ؟!!
بێڕەحمانە
پەتی تاوان
سێدارەیان بۆت داناوە ؟!
لە ڕقی وەی خۆڕاگری
ئەبێ پەنا بۆچی بەرن

لەداخانا

ئەبیٚ پەنجەت...، ئەژنۆت...،

سەرت

کامیان ببڕن

* * * * * *

مۆڤیٚکی شوون بزری ،

گڕو گڵپەی

شۆڕشیٚکی‌نویٚ تری ،

سەد ئەوەندەی

ئەوان سورن

هەزار هیٚندەش

بۆ ئازادی ....، مافی مرۆڤ تۆ سوور تری

تۆ هەڵگری

پەیامیٚکی پیرۆزتری

لەمانگانەی دەنگی غەریبان ژمارە ١٠ساڵی یەکەم لە بریتانیا بلاّوکراوەتەوە

مەخموور ١٩٩٩

# (( واعتصموا بحبل الله ))

لەوەتەی هەم
من دوو لەتم
بێ خودان و دەست بەرداری
سەد دەرفەتم
بۆیە ئێستا بێ ناسنامە و ...
بی شوێن و مەملەکەتم
باش نەزانم بەچی کەوتم
من دەست گرتەی
سێچوار پەتم
جارێ لاشەم لەسورنەنێن
کۆمەنیستم ناو لێ نەنێن
جارێکی تر دیموکراسی
کە نا زانم دەنگ و باسی
جارێکی تر نوێخوازی
مافی ئافرەت جنس بازی
ئەم جارەیان ...
وەرن وەرن برایەتی
یەك نەتەوەی کوردایەتی
بۆ دوا جاریش
درۆی زلی تیرۆرستی
دوور کەوتنەوە لە ئاین و
خودا وویستی .

کەلاتی ٢٠٠٣

# بڕیار

وەرزێکی شووم بەڕێوە !
بێ باران و کرێوە ،
وەرزی مەرگی
ووشەو شیعرە ،!
وەرزی مەرگی
ڕۆژنامە نووس و نووسەرە ،
وەرزی درووێنەی
کەلەی سەرە !
لەم دەقەرە ساردوو سڕە
لەم پەیامە جەرگ بڕە
ئەوەی ئەڵێ : ..
شەو ڕووناکە
مێردە زمەی ئەم سەردەمە
پیاوی چاکە
ئەوەی ئەڵێ :
ئەفرەت لەخۆم ..!!
ئەلەم خاکە
خۆی و شیعر و پێنووسەکەی
بۆ زیندان و
بۆ ژێر خاکە

١٩٩٩

لە ڕۆژنامەی کۆمەڵ ژمارە (٢٦) سالی یەکەم ٢٠٠٢/٥/١٦
بلاوکراوەتەوە

# میوان داری

ئەگەر هاتن ،
لێم مەپرسن :
وولاتەکەت لەسەر نەخشە
بێسنووورە و بەبێ خالە .
بۆ نازانن ؟ !
سەدان سالە
خانە خوێمەو
هەر دوژمنیش خاوەن مالە

* * *

ئەگەر هاتن ،
وولاتەکەم بێ پاسەوان ...
بێسانسۆرە
ئاگادارین !!
دز و جەردەی گەلێ زۆرە .
دزی ئێمە
شەیدای زێڕ و دۆلار نی یە
دزی ئێمە گیرفان بڕەی
بازاڕ نی یە
چەتەکانمان

هەموو خەمیان هەر دزینی ئازادیە...
هەر بڕینی ئەو زمانەی
فێرە حەق بیژی و ڕاستی یە

* * *

من کوڕی وولاتی خۆرم
مێژووم وونە !
چ شك نابەم
دەور و پشتم
هەر دوژمنە
گوایە ئێرە
نیشتمانی خانی و نالی...
نیشتمانی حاجی و مەحوی و
مەم و زینە ،
ئەگەر هاتن بە جل و برگی
سەوز و سپی سەردانم کەن
بابزانن ئێوەش وەك مە
برا کوژ و خوێن ڕێژ نینە

٢٠٠٣/٢/٢١ کەلاتی

# (( هەردێتەوە ئەم ئیسلامە ))

کاروان دەڕواو
بەڕێوەیە ،
ئەم سەردەمە
سەردەمێکی بە پەلەیە !
ئەم جیهانە
وەك گوندێکی . بچکۆلەیە
زانست لەو پەڕی لوتکەیە
چاونەترس و شارەزانە
ڕێبوارانی ئەم ڕێگەیە
با دەست گرین بەم پەیامە
هەر دێتەوە ئەم ئیسلامە
ئاگاداربن !...
چەند ئیبلیسێ لە بۆ سەنە ...
بەڕێوەنە
بۆ نەمانی
ئەم ڕێبازی موحەممەدە
ئەبوجەهل و
وەلیدی بن موغیرەنە

مەخمور ٢٠٠٠/٨/٩

لەبلاوکراوەی مانگانەی (دەنگی غەریبان) ژمارە (٥) لە بەریتانیا بلاوکراوەتەوە

# ئیسلام

تۆ نەیاساو
نە نووسراوەکانی حامورابی ،
نە پاشماوەی
سۆمەر و کلدان وئاشوری
نە ئاین و
نە شارستانیتی رۆمی ،
نەکەلتوری میدو ئاری
نە پەیڤەکانی
زەردەشتی کۆنە پێغەمبەری خۆمی ،
نەهۆنراوە هەڵواسراوەکانی
ئومرە ئول قەیسی
نەشەریعەتی
کیسرا و مەقەو قی‌سی
تۆ جیاوازی پەیڕەوانی
خاچ پەرستی ...
تۆ دوژمنە سەر سەختەکەی
ئەوەی مە یمون...
ئەسحاب سەبتی
تۆبەرنامە و دوا پەیامی
تۆ دیاری پەروەردگاری
تۆ ئاینی یەکسانی و ...
خوا پەرستی

جەژنی قوربان ١٣/٢/٢٠٠٣ مەخمور

# بۆ پێغەمبەری

ئێوە بەقەد ئەوس و خەزرەج
خوێنتان نەڕشت
ئێوە بەقەد قورەیشیەکان
شەڕتان نەکرد
بەلاَم ئەوان پێغەمبەریان
موحەممەد بوو
دوای چەندین ساڵ براکوژی
بوون بەبراو بە پشتیوان
هەوای ئیسلامیان هەڵمژی
بەلاَم ئێوە
لەخوێن ڕشتن بەردەوامن
نە موهاجیر
نە ئەنسارن
برا کوژی لاَدێ و شارن

۲۰۰۲ .هەولێر

# ئاكامی پەیام

باری کەرێ

لە باروووت و تەقەمەنیم

لەئێوە خواست، ...

دەرگای دڵتان هەرهەمووتان

بەڕووگرژی لەمن داخست

ووتم وەرن کۆببنەوە

بۆ بەرگری سنوری خوا

ووتیان سەیرە! ...

ئیسلام و چەك لەم سەردەمە

پێیان ووتم :

گەر ئەتەوێ ئەم ئیسلامە

رزگار بێ

برۆ کونجێ یادی خوا کە

لە مزگەوتێ

پێیان ووتم :

بەسیە بۆ تۆنوێژ و

ڕۆژوو حەج و زەکات

تۆ نەتەوێ ئەم قورئانە

بکەی بە دەستووری وولآت

پێیان ووتم :

دین و دەولەت .... پیاوی مزگەوت

هەرگییز ناشێ بۆ ڕابەری

بۆ شۆڕشی سەرتاسەری

ووتم وەرن کۆبینەوە

لەم دەڤەرە لەم وولآتە ووردبینەوە

تا کۆچ نەکەین

خۆ چەك نەکەین

بە ئاکامی ئەم پەیامە

هەرگیز ناگەین

# (( سکالاَی پێشمەرگەیەك ))

لەگەڵ یەکەم بانگەوازی
دەنگی شۆرش
من ڕا پەڕیم
کۆنە چەکم کردە شان و
ڕوو لە چیا
بۆی دەرپەڕیم
لەکاتێکا نانی ڕەق و...
ئاوی پیس و ...
بێ پێلاوی
برسێتیم دی
لەکاتێکا سەدان شەڕ و ...
پێکدادانی ...
برین داری و...
داستانم دی
لەکاتێکا ئەم ئەزانی ،
دواڕۆژی من ئەگا بەچی !..
یەك مەرامم لە دڵ دابوو
بۆ کوردستان پێشمەرگەمەو
هەر هیچی دی
کەچی ئێستا
هیچ دەرگایەك لەڕووی مندا ناکرێتەوە
یەك دەعوەتی شەوی نادی
دە ساڵ خەبات دەسڕێتەوە

١٩٩٢        کوران . هەولێر

# (( پاداشت ))

١٨٢ هەزار گۆڕ
لەکوێ بێنین
١٨٢ هەزار گوڵ
بابچێنین
١٨٢ هەزار مۆم
داگیر سێنین
١٨٢ هەزار زام
١٨٢ هەزار ژان
١٨٢ هەزار
لاندگرۆزی تایە پان
دێن و دەچن لە کوردستان
ئەی هەڵە بجە
ئەی ناسنامەی کوردی بێکەس
من نازانم
مژدەت پێ دەم ؟...
یا ئەم جارەش لە نێو گۆڕا
بەگازێکی ژەهراوی تر
شەهیدت کەم ؟.
ڕۆلەکانت
وا پێشبڕکێ و
ململانێیانە
بۆ گەیشتن بەدیداری دیکتاتۆر
خوێنی تۆش
شەڕابێکی
تفت و تاڵ و سوێر

٢٠٠٢

# بژی چەك .. .. .. بمریٚ چەك

هێزی دەستی چەوساوەی
هۆی سەرکەوتنی کاوەی
تۆ دۆست و تۆ دوژمنی
خوێنرِێژا گەلیٚ منی
تۆ ئەنفال و هەلەبجەی
تۆ دیرۆکا تالاٚ مەی
تۆ خۆشی دەست و پەنجەی
بەرۆکی کورد بەرنادەی
پارێزەری ئەو ناوەی
خۆشەویستی ئازاوەی
لەرۆژی تەنگانەدا
کەس دەستی تۆ بەرنادا
کاتیٚ ئاشتی دێتەوە
بێزیان لێت دەبێتەوە
کە کورد دات ئەنێن دیلن
هەڵتدەگرن زەلیلن
تۆ بەو رِۆژەت گەیاندوون
تۆ بەدونیات ناساندوون
هەلگری ئەو ئازناوەن
گەر تۆ نەبی چەوساوەن
سەر بە ئاحەز شۆڕدەکەی
دەست کەوتی کورد تێك دەدەی

چەك بۆ ئاشتی نەوەك شەڕ
نەك سووتانی ووشك و تەڕ
بمرێ چەك ،هەر چەك بژی
سەرکەوتن ، برا کوژی
کاتێ شان هەڵت دەگرێ
هێز و غیرەت دەیگرێ
ساتێ خوێنێ دەڕێژێ
بمرێ چەك نالێم بژی
بۆموسڵمان تۆ پشتی
تۆ هۆی چوونە بە هە شتی
چەکی دەستی عوبەیدە
ئەم ڕێبازە بەر مەدە
شمشێر و تیری خالد
شکاندی کوفری وەلید
بەژن و بالآی بێمەچەك
ڕیش درێژی بەبێ چەك
نەك خاچێ هەزار خاچێ
دێن و دەچن لە خاکێ

٢٣/ ڕەمەزانی ٢٠٠٣ کەلآتی

# (( ڕەوشت ))

ئەمڕۆ ویژدان
لەبەر دەرگای دادوەریدا
سەر بڕاوە ،..
کێ بێ مێژووی
پرسەروەری ئەم کوژراوە
بگەیەنێ بەدوارۆژی
کوردەواری
بەبڕواوە !؟..
ئەتۆ لانە
ئەی وولاتی چاولێ کەری
مەملەکەتی
سەیرو سەمەرەی ترسناك
گەر وابڕوات
دڵنیابە بەتۆ ناگات
پارێزەری خاوێن و پاك

گوایه ڕقمان لەتاوانە

ئاکاری من

ئاکاری تۆ

کەی ئاکاری موسڵمانە

خۆ دەخوێن و بێ شەرمانە

کڕنۆش دەبەین

بۆ بێگانە

داب و نەریت ، هەڵوێستی کورد

ڕەوشتی پاك

کوا ئەو گەلەی بۆ درووشمی

ئەم ئیسلامە

دەبوو بە خاك .

# (( دەنگ و باس ))

کورتەی هەواڵ :..
مەرگی ووشە ،
تەرمی شیعر ،
ڕق لەخۆبوون
ڕووخانی دڵ
ئەنفالی ڕەووشت و وویژدان ،
کاسە لێسی دار بەدەستی
دەم بە ستراوی
ڕۆژانی پڕمەترسی
لەسەردەمی شەڕە کورسی
دروێنەی ماف
بەداسی دەستی بەش خوراو
بەندی بەندو
ئازادی بنەماڵە
گوێ بگرن بۆ ئەم هەواڵە .
تەمێی درهەم
تەمێی دیاری
بازاڕی ڕەش
دە بە چوار
شەڕی یەکتر قسەو باسی
بن دیوار
ڕێپێوانی ڕەزامەندی
درکاندنی بەندایەتی
پێش بڕکێی درۆ
وون بوونی ڕاستی

٢٠٠٣/٥/٢٩

# ووتـار بێژ

پە نجەکانم بقرتێنن .
ئەگەر ویستیان
درۆی سەردەم بۆ لەتێ نان
بنەخشێنن ،...
گەر بینیتان
هێدی ...هێدی هەنگاو دەنێم
بەرەو چەوتی ،
قاچەکانم لە ئەژنۆوە ببڕنەوە
با سنوری پەروەردگار
نەبەزێنن ...،
دەنگم کپ کەن
دەنگم کڕکەن
ئەگەر دنگی ( بیلالەکەم )
لە بلند گۆ
بە گوێی دۆڕاو
نەدرکێنن
گەر دروشمم هیلال نەبوو
بەشمشێری ( صلاح الدین )
دەستم ببڕن ،
گەر وانەبوو درۆ دەکەم ..!
لەسەر مینبەر گوێم لێ مەگرن

٢٠٠٠/٣/١٤

لە مانگانەی دەنگی غەریبان لە بەریتانیا بڵاوکراوەتەوە ژمارە ( ٦ )

# سکی برسی

لەبیرتانە

بۆ لەتێ نان

ماڵ بەماڵی گوندەکە تان

دەپشکنی و بۆی دەگەڕان

لە بیرتانە

لەکاتی هاتنی بەعس و

جاشەکانا

دە مان بردنە سە ر جێی بووك و

کچ وژنەکا نمان

لە ترسانا

بۆ گوێ ناگرن

لە گریانم ؟!..

بۆ نا پرسن

لە سکی برسی منا لانم ؟!

ئا ئەوانە

کۆرپەی ڕەش و ڕووتی منن ،...

کەسێ ناڵێ

وەرن وەرن
نانی گەنم
نانی گەرم
سواڵم کرد سواڵ
نەوەك بمرن لەبرسان
دەستم بردو
پاڕامەوە لە ترسانا
پێش ئەوەی بێ
سەرماو سۆڵی ئەم زستانە
لە پێش دەرگای
مزگەوتەکان
کەنیسەکان
هاوارم کرد
خێر خوازەکان
نەوت و دەرمان
گەنم و نان
بۆ لێ قەوماوانی
کوردستان

١٩٩٩

# دیاری هەندەران

تۆ لەترسی
مەرگ و زیندان
پەنات نەبرد
بۆ هەندمران
بۆ ڕابواردن ...،بۆ لنگ بازی
ئاوارەیی و
ئەم دووریەت بۆ خۆت خوازی
* * *
موسلمانی بەزوویانی
مەردی ڕۆژ و
مردووی شەوانی
چاو ساغی ڕێ و بانی شاری
بۆ دیدەنی بەژن و بالاو
قژی درێژ
زانای چاکی
بۆ بردنی ئابڕووی خەلکی
گەلێ چەلەنگ و چالاکی
گوایە ڕەخنەت
زۆر گرتووە

دوای بیستساڵی

دوورکەوتنەوەت

کوردە هێشتا دوا کەوتووە

* * *

لێرە چەکوژ

باس و خواسی سەر زارت بوو

داسی شکاو

مافی چارەی

کرێکار و جووتیارانی

نەزانت بوو

ئەم جارەیان

تە پڵی وانەی

مافی ئافرەت ....، .... مافی مرۆڤ

وا لێ ئەدەی

لەگەڵ خۆتا

وەکو دیاری

سێ مێردی تر

بۆ ئافرەتە دەم شڕەکەی

خۆشت دەبەی

١٩٩٩/١١/١٧

# وویژدان مردوو

لەتەمموزی

ئەوەی دۆزەخ

تۆ خوڵقاوی

شیرە خۆرەی

لەگەڵ میشیل

بەمناڵی

لەگەڵ ئیبلیس تێکەڵاوی

لە دوای حەوت شووی

مامۆژنی عەریف عەلی

لە حۆجەکەی

کەعبەی خۆتدا

بەزۆڵ ..، بەشەڕ ...،

چەقاوەسوو

تۆ ناسراوی

کاتێ (کلۆد)

خەڵات کرا ..!

ئەوسا ناوی بەد ناوی تۆ

لە نێو لیستی

وویژدان مردووەکان نوسرا
ئەوان سەد و پەنجاهەزار
گۆڕیان هەڵکەند !!..
لەکوێن گۆڕی
بارزانیەکان ؟؟..
کوان سەد و هەشتاو
دوو هەزار
ئەنفالەکان ؟!
لەگەڵ ئازاری
هەڵەبجە
لەگەڵ ڕقی پێوەند و
دەستانی پڕ کەلەبچە
تەنیا گۆڕێ
بۆ سەر...،...لاشە...،
دەست و پەنجە

١٩٩٩

(کلۆد ئیزلی) : لە جەنگی جیهانی یەکەم خەلاتی جەنگی ئەمریکی وەرگرت
دوای کوشتنی (١٥٠) هەزار یابانی بە گازی ژەهراوی ، دوایی شێت بوو .

# ئاگاداری

درۆی زلن ،
یاسای کاتی سەرخۆش کەرن
ڕێ سای ساتی سەر کاخەزن
مافی مرۆڤی کەنیسەو . . .
ڕووتی ئافرەتی ئابووتن
کە ئەمرۆکە پێی دەنازن
سێ سەد ساڵە
کێڵگە کانمان
درۆی پاپاو قەشەکانیان
بەرهەم دێنن
سێ سەد ساڵە
داسە کانمان
بۆ خەرمانی
بیری بۆگەنی ڕۆژ ئاوا
لە دروێنەن

* * *

مەخەڵەتێن
چەند باسێکی سەر زارەکێن
بانگەوازی ڕۆژی شڕن
ئەمە NATO
ئەمە UN
لە ئاست تاوان ،لە ئاست سووتان
لەئاست ئەتك و قڕو تالآن
دەم بەستراوی لاڵ و کەڕن
بۆ هەلەبجە و ئەنفالی کورد.
بۆ بۆسنیا و بۆ کۆسۆڤۆ.
بۆ گرۆزنی بۆیێدەنگن
سەرکردەکان کاسە لێس و
سەگی ڕۆمن

٢٠٠٠/٢/٦ مەخموور

لە مانگانەی ( دەنگی غەریبان ) لە بەریتانیا بلأوکراوەتەوە

# گەڕانەوە

بۆ سەفەری حەزو خۆزگە
هەنگاوەکان شەکەت نابن
بۆ ساتێکی حەسانەوەی ئارەزووەکان
سەدان شەقام لەبڕانن
لە گێژاوی خۆشی تام و.
چێژی دونیا
سەدان دەم و
سەدان گەروو لە خنکانن
ئەریٚ نەفسە سەر شێتەکە
جلەوی تۆ لە دەست کیٚیە
بەسیە ئیتر
بەرەو دۆزەخە ئەم ریٚیە
جاریٚ بیرت نەکردەوە
لەم یاسایە لەم گەردوونە
لەم ژین و مردن و بوونە
بگەڕێوە بۆ لای خودا
تۆبەیەکی راست و ڕەوا
پەیمانێکی بەندایەتی
بەلێنێکی مەردایەتی
با هەلەکانی ڕابردووت
بسڕێنەوە لە لەش و ڕووت
خوا تۆبەکاری خۆش دەویٚ
پەشیمانی لە تۆ دەویٚ
ڕوو لە ڕووگە پشت لە تاوان
بۆ سەر بەرزی هەردوو جیهان

لە ماگانەی دەنگی غەریبان لە بەریتانیا بلاوکراوەتەوە ژمارە ( ٨ )

# ڕاستی

ئەوەی بۆڕاستی دەنووسێ

لە زەبری زیندان ناترسێ

ئەستەمە لای کڕنووش بردن

پاڕانەوە لە هیچ کەسێ

* * *

ئەوەی دەستی داوەتە چەك

باوەڕدارە بەخوا و مەچەك

سەردەکەوێ ئەم پەیامە

بە جوان بێژی و ترسی کوتەك

* * *

ئەوەی ئازادی مەبەستە

دڵ و گیانی لە سەر دەستە

بۆ گەیشتن بە فیردەوسێ

هەر دەم شەهیدی پێویستە

# (( سی و دوو دڵی زیندوو ))

پێشکەشە بە

مامۆستا عەلی باپیرو هاوەڵەکانی لە زیندانا

شەوەو هاتووم
لەدوورەوە ،
هێدی هێدی
لە پشت شوورەی بەندیخانە
بۆنی دەکەم ..
بۆنی میسك و بۆنی نوێژ و بۆنی قورئان
بۆنی پەیڤ و بۆنی سیدق و بۆنی ئیمان
گەرچی دوورە
دڵنیامە ئەوە بۆنی
دار و بەردی
هەورامان و شارەزوورە ...
دڵنیامە ئەوە خاك و
خۆڵ و گلی تەوێلەیە
ئەوە ئاوی بیارەیە
ئەوە خوێنی
شەهیدانی هەڵەبجەیە ،
بە ئەسپایی بانگت دەکەم :
ئەی مامۆستا
ئەی ئەمیرم
گوێ ڕادێرە
من هەواڵ و موژدەم پێیە
بەندە دەنگی چەندان ملیۆن
مووسڵمانی کوردی پێیە

من هەواڵی ڕێپێوانی قەڵام پێیە ،
من هاواری منارەکەی چۆلیم پێ یە ،
دەنگی ناڕەزایی
نوسەرانم پێیە
نیگەرانی خووشك و
براو باوکم پێیە
دەنگی سەرجەم چینەکانی گەلم پێیە
دەنگی ئاو و شاخ و کورسانەکەتم پێیە
چیت پێبلێم ئەی ئەمیرم
ئەی پێشەواو ئەی هاوبیرم
تۆ لەدڵی هەموومانی
تۆ ئێستاکە لە نێومانی
سی و دوو هزرت داڕشتووە
سی و دوو دڵت جێ هێشتووە
هەردلێکت هەزاران جار
چاپ کردووە
هەر کەسێکیش بەش و مافی
لەم دڵانە بەرکەوتووە
تاکو مووسڵمانی کامل،
تا سۆزی ئەتەوایەتی ،
تاکو جیهاد لەڕێخوادا ،
تا ئیسلام و ڕێچکان مابن
تۆ هەر زیندووی
دۆست و دوژمن با بزانن

٢٠٠٣/٨/٢ مەخموور

## (( پەروەردەی چەوت ))

جا من چی بکەم

لەدایك بووم

بە چەقۆیەکی کۆڵ و پیس و، ...

نووك ژەهراوی

ناوکیان بڕیم

قورئانێکی ،

لول دراوی پەڕۆ سەوزی

تۆز لێ نیشتووی ...

نەخوێندراوی ،

ماڵی مەلای سەرفترە خۆر

بوو بەدیاری

چاوی جوا نمیان

پڕکرد لە گڵ

تا ببینم

چاو تیژ ببم

بەڵام چ گڵ خۆزگەم بە گڵ
ترسی شەوە
هەر هەموویانی شێواندبوو
گریانی من
هەر هەموویانی گریاند بوو
مامە شێت و نەزانەکەم
تفی پیسی بۆن دووکەڵی ،
پڕ میکرۆبی کردە دەوم
تا ئازا بم ... تا ووریا بم
وەکو مامم
حە تحەتۆکە و ...
قەنەفر و سەدان نووشتە
بە لانکە شکاوەکەم،
هەڵواسرابوو ...
دوعای شێخ و مەلا ژن و ...
بەردی گۆڕی پیاوچاکانیش
لەم لاو لەولام
داندرابوو
هەر بۆ ئەوەی لەچاو نەچم

بۆیە ئێستا هێندە گەوجم
پەحپە و کخەی سەر زارم بوو
یەکەم کار و چالاکیشم
جنێو دان و تف کردن بوو
کە پام گرت و ،
چوومە مەکتەب
بۆ فێر بوونی پیتی کوردی
مامۆستاکەم فێری کردم
تێ هەڵدان و ترس و تۆقین
زۆر بە ووردی
منالانی گەڕەکیشمان
فێریان کردم
بە دارلاستیك
چۆن بشکێنم گشت پەنجەرەی
دراوسێکان
بەرە بەرە ، ..
مەزن دەبووم

جگەرە ،

دزی ،

درۆو قومار

حەپس

و

برسی

و

لێدانی دار

ئەم جارەیان دەرسی بەعسی و

ئاوارە بوون

بۆ دوا جاریش

براکوژی و ماڵ وێران بوون

٢٠٠٣/١/١

# کۆچ و چەك

یەکەم ووشەی پەرتووکی من لەحەڕرابوو
کاتێ مرۆڤ لەگێژاوی
نەزانین و
لەگومڕابوو
جوبریلی پاك
کە سروشی بە تۆ گەیاند
لات وعوزای
لە نێو دڵی هەزار قوڕەیش
بی شك ڕماند
ئەم ئیسلامە سەرنەکەوتوو
جێگیر نەبوو لەنێودڵان
تا کۆچ نەکراو
شمشێرو تیر نەکرانە شان

ژمارەی سپاردن (۲۲۷) ساڵی ۲۰۰۳